190




# جگەرگۆشەکان



گۆڤارێکی پەروەردەیی مانگانەی منداڵانە

یەکەم ژمارەی لە ئابی (١٩٩٣) دەرچووە.
متمانەی سەندیکای ڕۆژنامەنووسانی
کوردستانە: ژمارە (١٠٥)




# جگەرگۆشەکان

ژمارە ١٩٠ کانوونی یەکەمی ٢٠١١

# پاییز



لویزا سەباح



ئەوا وەرز دەگۆڕێ
پاییز دێتەوە سەر ڕێ
گەڵای درەخت دەوەرێ
نم نم باران دەبارێ
ئاسمان کەمێ مات دیارە
زەمین زەرد و خەمبارە
بەڵام ئێمەی مناڵان
دڵمان خۆشە گشتساڵان
نوێ دەبنەوە وەرزەکان
درێژە دەدەن بە ژیان
نمەی باران گشت کاتێ
بۆنی خۆشمان دەداتێ

نیگاری سەر بەرگ (مەریەم عەبدوڵڵا)

خاوەنی ئیمتیاز:
حامد محەممەد عەلی
hamidali64@yahoo.com
Mob. 07504513424

سەرنووسەر:
عەلی سالح میران
alisalhmiran@yahoo.com
Mob. 0750 452 9522

سکرتێری نووسین:
زیاد ڕەشاد قادر
zirak1974@yahoo.com
Mob. 0750 462 5782

دیزاین و کاری هونەری
سەرکەوت عەزیز
sarkawt977@yahoo.com
Mob. 0750 456 7864

سەرپەرشتیاری چاپ:
نوێد شوانی
Mob. 0750 465 3115

ئیمەیلی جگەرگۆشەکان:
jgargoshakan@yahoo.com
پێگە لە ئینتەرنێتدا:
www.kurdiu.org

ناونیشان: هەرێمی کوردستانی عێراق/ هەولێر، گەڕەکی تەیراوە، تەنیشت گۆڤاری پەیامی ڕاستی

نرخی 750 دینارە

لە چاپخانەی ژین چاپ دەکرێت

و. له فارسییەوه:
سەرهەنگ عەبدورەحمان
نیگار:
هونەر مەلا حەمەدەمین

# بۆق و گا

لە دەریاچەیەکی ئارامدا کۆمەڵێك بۆقی گەنج بە شادومانییەوە هەڵبەزودابەزیان دەکرد.
گایەکی تینوو بۆ ئاو خواردنەوە هاتە سەر دەریاچەکە و ئاگای لە بۆقە بچووکەکان نەبوو، زۆربەیانی پان و پلیش کردەوە و کوشتنی.
وەختێ دایکە بۆق گەرایەوە، بۆقە گەنجەکان ئەو رووداوە ترسناکەیان بۆ گێرایەوە: ( دایە. . دایە، ئاژەڵێکی گەورەی چوارپێ زۆر بە خێرایی بەرێدا دەرۆیشت، تەپ تەپ! هەر بۆیە زۆربەمانی پان و پلیش کردەوە). دایکیان ویستی بزانێ کە ئەو ئاژەڵە چەندێك گەورە بوو، هەر بۆی فووی کردە خۆی و پرسی: ئایا بەقەد من گەورە بوو؟
بۆق قۆقیلەکان وەڵامیان دایەوە: نەخێر گەورەتربوو.
دایکە بۆق زۆر تورە بوو، ئەو هەر فووری دەکردە خۆی و لێی دەپرسین، بەڵام بۆق بۆقیلەکان هەر پێیان دەگوت: نەخێر.. تۆ هێشتا نەبوویتە نیوەی ئەو.
دایکە بۆق فووی زیاتری کردە خۆی و دووبارە پرسی، بەڵام بۆق بۆقیلەکان هەر پێیان دەگوت: ناوەڵڵا.. تۆ هێشتا نەبوویتە نیوەی ئەو.
دایکە بۆق هێندەی تر تورە بوو، بێ ئەوەی گوێ بداتە خۆی هەر فووی دەکرد و لەشیشی بەرگەی لەوە زیاتر گەورەبوونی نەدەگرت و کتوپڕ سکی تەقی و بۆقی داماو لە کەنار دەریاچەکەدا مرد.

(بەر لە ئەنجامدانی هەر کارێك، رادە و توانای خۆت بزانە)



# ژیان لە دارستاندا

شیعری: ئەمین محەممەد / سلێمانی
نیگار : هونەر مەلا حەمەدەمین



لە دارستان راوەستابووم
لە جولەی گیاندار رامابووم
چاوم گێرا دوو سمۆرە
بازبازێن دەکەن بە نۆرە
رێوی لەگەڵ بێچووەکانی
بۆ [illegible]یان دەروانی
لەبەر [illegible]مات فیشکانی
[illegible] دەرهانی
ئیتر هەریەك بەلایەکا
خۆیان کرد بە پەنایەکا
ماریش کاتێ ئەوەی بینی
وەستا لەبەر پێکەنینی
وتی بۆ ترسان بەم شێوە؟!
هاتووم ببمە هاورێی ئێوە



# پێویستە بۆ قوتابی

نووسینی: رزگار مامە گەردی
نیگار: مەریەم عەبدوڵڵا

1 ) پێویستە قوتابی دڵنیابێ لەوەی کە هەموو پێداویستییەکانی لایە وەکو پەرتووک و پێنووس و قەڵەم و ئەوانی تر.

2 ) دەبێت گرنگی بدات بە خاوێنی جەستە و ڕێکوپێکی جلوبەرگی، نینۆکەکانی بکات و قژی جوان ڕێک بخات.

3 ) پەرتووکەکانی بەرگ بکات و خاوێن ڕایانبگرێت، چونکە خەڵکی تر دوای ئەو سوودی لێ وەردەگرن.

4 ) پاکوخاوێن ڕاگرتنی قوتابخانە و فڕێدانی زبڵ لە شوێنی دیاریکراو، چونکە قوتابخانە موڵکی هەمووانە نەک تەنیا هی یەک کەس.

5) مامۆستاکان لە شوێنی دایکان و باوکاندان، بۆیە دەبێ تا ئەوپەڕی توانا ڕێزیان لێ بگرین.

6 ) هێمن و بێدەنگ بیت لەکاتی وانە گوتنەوە لەلایەن مامۆستا، چونکە ئەوە وادەکات مامۆستا باشتر وانەکان ڕاڤە بکات و قوتابییان باشتری لێ تێبگەن.

7 ) گرنگیدان بە وانەکانی ڕۆژانە و خوێندنی بەردەوام وادەکات لە سەری ساڵدا بە ئاسانی وەڵامی پرسیارەکان بداتەوە.

8) زوو نوستن و زوو لەخەو هەستان وادەکات قوتابی گورجوگۆڵ بێت و هەست بە سستی و تەمبەڵی نەکات.

9 ) پاراستنی کەلوپەلی قوتابخانە وەکو: کورسی و دەرگا و پەنجەرەی پۆلەکان و شوێنی ئاو خواردنەوە و دەستشۆر و شتی تر.

10) پاراستنی باخچەی قوتابخانە، بەهیچ جۆرێک گوڵەکان نەقرتێنین و دارەکان نەشکێنین.

11) پاراستنی پانکە و ساردکەرەوە و سۆپاکان، نابێ لێیان نزیک بکەوینەوە و یارییان پێ بکەین.



# مۆدێلی سەرتاشین

سیناریۆ و نیگار: خالید ئەلسوێد
وەرگێڕانی: جگەرگۆشەکان










سەرچاوە: گۆڤاری (العربی الصغیر) ژمارە ( 230) نوڤەمبەری( 2011)

# ئایا دەزانی دەست و پێی ڕاست لە هی چەپ گەورەترن؟

هەردوو لای ڕاست و چەپی مرۆڤ سەدلەسەد وەکو یەك نین و بەشێوەیەکی گشتی دەستی ڕاست لە دەستی چەپ تۆزێك درێژترە، هەرورك پێی ڕاستیش کەمێك لە پێی چەپ درێژترە، زانایان پێیان وایە تەواو پارسەنگ نەبوونی پەلی لای ڕاست و لای چەپی ئادەمیزاد زێتر بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە بەشی هەرە زۆری مرۆڤ دەستی ڕاست و پێی ڕاستیان پتر بەکاردێنن لە هی چەپ، بۆیە پەلی لای ڕاست زۆرتر گەشە دەکات و تۆزێك گەورەترە لە پەلی لای چەپ.







ئا: جیهان نەبی

## ناوی کوردی

منداڵە خۆشەویستەکان، لەم گۆشەیەدا هەر جارە بە مانای ناوێکی جوانی کوردی ئاشنا دەبین :



### بەهێز

ناوێکە بۆ کوران بەکاردێت، بەهێز بە مانای (خاوەن هێز، بەتین، بەتوانا) دێت، ئەم ناوە لەگەڵ ناوەکانی (پەرێز، ئارێز، بەرێز و کارێز) ڕێك و گونجاوە.



# چی دەربارەی هەرمێ دەزانی؟





میوەیەکی ئاوداری تام و بۆن خۆشە، هەرمێ ٢٠جۆری جوداجودای هەیە و ئەم جۆرە میوەیە چەندین تایبەتمەندی هەیە، لەوانە:

١) گەدە بەهێز دەکات و پاکی دەکاتەوە.

٢) تینویەتی ناهێڵێت و قەبزی لادەبات.

٣) لێدانی دڵ ئارام دەکات.

٤) لیکی ناو دەم زیاد دەکات و کارئاسانی بۆ دەزگای هەرس دەکات.

ئا: پەیام زیاد/ هەشتەمی بنەڕەتی

# گوڵەبەرۆژە



منداڵە خۆشەویستەکان سڵاو، گوڵێکی زەردم وەك خۆر و زۆریش حەز لە خۆر دەکەم، بۆیە هەمیشە لە خۆ دەڕوانم، من گەڵای پان و قەدێکی بەرزم هەیە کە بەرزییەکەم ١ - ٣ مەتر دەبێت، نیشتمانی سەرەکیم ئەمەریکا و ئەرجەنتین و رووسیایە، نزیکەی ( ٦٠ ) جۆرم هەیە، سوودێکی زۆرم هەیە بۆ ژینگە و زیندەوەران و مرۆڤ، شیلەی گوڵەکەم سەرچاوەیەکی دەوڵەمەندە بۆ هەنگ لە دروستکردنی هەنگویندا، تۆوەکەشم لەلایەن مرۆڤەوە سوێر دەکرێت و دەخورێت، هەروەها لە کارگەدا رۆنی لێ وەردەگیرێت کە لە ئامادەکردنی خواردندا بەکاردەهێنرێت.

ئامادەکردن و نیگار : مەریەم عەبدوڵڵا

# سۆزان و سازان

ئا : سۆما جەلالەدین/ پێنجەمی بنەڕەتی
نیگار: هونەر مەلا حەمەدەمین

سۆزان و سازان و برادەری یەکدی بوون، زۆریان یەکتر خۆش دەویست، رۆژێك سۆزان و سازان دەچوون بۆ قوتابخانە، پێکەوە لە ڕێگادا باسی هەندێك شتیان دەکرد وەکو یارمەتی دانی خەلکی.

سۆزان گوتی: من دوێنێ منداڵێکم دی کە کەوت و دەگریا منیش هەڵمگرتەوە و بردمەوە ماڵی خۆیان، ئەی تۆ چیت کرد سازان؟

سازان گوتی: منیش پێرێ هاورێیەکم نەخۆش بوو چووم سەردانیم کرد.

هەر باسی یارمەتییان دەکرد هەتا گەیشتنە قوتابخانە و وانەکانیان خوێند و گەرانەوە ماڵەوە و هەریەکەیان چوونەوە ماڵی خۆیان و قسەکانیان بۆ دایك و باوکیان گێرایەوە کە یارمەتی خەلکیان داوە، ئەوانیش دەستخۆشییان لێکردن و هیوایان خواست لەسەر ئەم ڕەفتارەیان بەردەوام بن.





# بەردێك سەر ئاو دەكەوێت!



بەردی (خەففان) كە لەلای ئێمە بە بەردی حەمام ناسراوە، بەردێكی رەشی كونكونە لە گركانەكانەوە پەیدا دەبێت، ئێمە كردوومانەتە عادەت بەهۆی زۆریی رووپەوە بۆ رنینی قلیشانی پاژنەی پێیان بەكاری دەهێنین.

ئەم بەردە سووكە و كونكونە و لە شلە تواوەكانی گركانەكانەوە دوای رەقبوونی دروست بووە و ئەم جۆرەیان بەوە دەناسرێتەوە كە زۆر زوو سارد دەبێتەوە، بە جۆرێكی وا كە ئەو گازانەی لەناویدایە تێیدا دەمێنێتەوە، هەر ئەم گازانەشە دەبێت بە هۆی سەرئاكەوتنی بەردەكە. خۆت تاقی بكەوە.

پەرچڤە: سارە مستەفا شێروانی

# فلچەی ددان

رۆژێك لە رۆژان دوو خوشك هەبوون بە ناوی (سۆز) و (رۆزی)، رۆزی لە سۆز بچووكتر بوو، بۆیە هەندێك جار هەڵەی دەكرد. جارێكیان پێش ئەوەی رۆزی لە خەو هەڵسێت سۆز هەستا چوو ددانەكانی بشوات سەیری كرد فلچەی ددانەكانی لە جێی خۆی نەماوە، هەر گەرا بەڵام نەیدۆزییەوە، پاشان چووە ژوورەكەی رۆزی تا بزانێ ئەو لە نەیدیوە، چووە ژوورەوە دی كە فلچەكەی لە ژوورەكەی رۆزیدا كەوتووە، لەو كاتەدا رۆزی خەبەری بۆوە سۆز پرسیاری لە رۆزی كرد: فلچەكەی من لە ژوورەكەی تۆدا چی دەكات؟

رۆزی گوتی: پێش ئەوەی بخەوم بە فلچەكەی تۆ ددانەكانم شۆرد و پاشان هێنامە ژوورەكەی خۆم. سۆز بۆی روون كردەوە كە بە كارهێنانی كەلوپەلی یەكێكیتر زیان بە تەندروستی دەگەیەنێت، بۆیە رۆزی بۆی دەركەوت كە هەڵەی كردووە داوای لێبوردنی لە سۆزی خوشكی كردوە بریاری دا هەرگیز كەلوپەلی یەكێكیتر بەكار نەهێنێت.



رێناس ئومێد حەمەئەمین/ شەشەمی بنەرەتی

وەرگیرانی: سیپان

# دوو گوێدرێژەکە

پیاوێك دوو گوێدرێژی هەبوو، ڕۆژێك کیسەیەکی گەورەی خوێی لە پشتی گوێدرێژی یەکەم و هەندێك ئیسفەنجی لە پشتی گوێدرێژی دووەم بارکرد و لە گوندەوە بەرەو شار بەرێکەوت، لە ڕێگادا گوێدرێژی یەکەم زۆر ماندوو بوو و گوێدرێژی دووەمیش باری سووك بوو، بۆیە هەر گاڵتەی بە گوێدرێژی یەکەم دەکرد، لەناکاو گەیشتنە ڕووبارێك، بەڵام ئاوی ڕووبارەکە زۆر بوو لەکاتی پەرینەوەدا خوێی سەر پشتی گوێدرێژی یەکەم توایەوە و بەمەش باری سووك بوو، کەچی ئیسفەنجی سەر پشتی گوێدرێژی دووەم پڕی ئاو بوو، بەمەش بارەکەی زۆر قورستر بوو، بۆیە گوێدرێژی دووەم هیچ دەنگی لێوە نەهات و پەشیمان بوویەوە لەوەی کە پێشتر گاڵتەی بە گوێدرێژی یەکەم کردبوو...





سەرهەنگ عەبدورەحمان:

# هیوادارم منداڵان گرنگی زۆر بە گۆڤار و کتێب بدەن

دیمانە: هودا ئیبراهیم / سلێمانی

**مامۆستا سەرهەنگ عەبدورەحمان ساڵی ١٩٧٦لە شاری سلێمانی لەدایك بووە، ئێستا مامۆستای هونەرە لە قوتابخانەی (هەواری شار)، خێزاندارە و کچێکی جوانکیلەیان هەیە بە ناوی (ڤارین)، ئەو ساڵانێکە خەریکی وەرگێڕانی بەرهەمی منداڵانە بۆ زمانی شیرینی کوردی و لەم کورتەدیدارەدا بەمشێوەیە هاتە دوان:**

جگەرگۆشەکان: یەکەم بابەتت کەی و لەکوێ بڵاوکردەوە؟

سەرهەنگ: ساڵی ١٩٩٣لە ڕۆژنامەی برایەتی کە دواپەڕەی تایبەت بوو بە نووسین لە بواری منداڵاندا شیعرێکم بڵاوکردەوە بەناوی (منداڵیکی دڵپاکم).

جگەرگۆشەکان: بابەتەکانت بەزۆری لەچ گۆڤارێکدا بڵاوکردووەتەوە؟

سەرهەنگ: (جگەرگۆشەکان، پەرستان، هەنگ، پەپوولە، تۆم و جێری....)

جگەرگۆشەکان: زۆربەی بابەتەکانی مامۆستا لە چ بوارێکدان؟

سەرهەنگ: چیرۆکی وەرگێڕدراون، تا ئێستاش بەردەوامم لەبواری وەرگێڕانی چیرۆکی منداڵان لە زمانەکانی (فارسی، تورکی، عەرەبی و ئینگلیزی) بۆ زمانی شیرینی کوردی.

جگەرگۆشەکان: بۆچی ئەو بوارەت هەڵبژارد؟ ئامانجت چیبوو؟

سەرهەنگ: خزمەت و ڕۆشنبیرترکردنی منداڵان، لەبەر زۆر بەسوودی ئەو بابەتانە و لەلایەکی دیکەشەوە نووسەر لەبواری وەرگێڕانی بابەتی منداڵاندا زۆر کەمن.

جگەرگۆشەکان: گۆڤاری تۆم و جێری چی بوو، چەند ژمارەی لێ دەرچوو؟

سەرهەنگ: گۆڤارێکی منداڵان بوو کە خۆم سەرنووسەری بووم، ( ٤) ژمارەی لێ دەرچوو، هەموو بوارەکانی تێدابوو: (چیرۆك، شیعر، هونەر، وەرگێڕان، فێرکاری، زانستی وێنەکیشان....).

جگەرگۆشەکان: بیرۆکەی گۆڤارەکە کێ بوو؟

سەرهەنگ: بیرۆکەکەی (کۆمپانیای خێزان) بوو، سەرەتا لە ڕێگەی هاوڕێیەکمەوە بوو بەناوی (م. سەلام کەریم)، کە خاوەنی کۆمپانیاکە بوو.

جگەرگۆشەکان: ئامانجی سەرەکی کۆمپانیای خێزان لە دەرکردنی ئەم گۆڤارە چی بوو؟
سەرهەنگ: تەنیا خزمەت کردنی منداڵانی کوردستان بوو لە هەموو بوارەکاندا.
جگەرگۆشەکان: ناونانی گۆڤارەکە بە (تۆم و جێری) دەگەڕێتەوە بۆ چی؟
سەرهەنگ: تۆم و جێری کەسایەتی ئیفلام کارتۆنی جیهانییە، کە زۆر ناسراوە لە ناو منداڵاندا و خۆشیان دەوێن.
جگەرگۆشەکان: ئەو مەرجانەی کە پێویستە لە گۆڤارێکی منداڵاندا هەبێت چین؟
سەرهەنگ: هەمەلایەنە بێت (فێرکارییانە، هونەری، وێنەکێشان، زانستی، چیرۆك و هۆنراوە....) کە بەداخەوە بواری زانست و زانیاری کەمتر لە گۆڤارەکانی منداڵاندا گرنگی پێدەدرێ، زیاتر گرنگی بە هونەری وێنەکێشان دراوە.
جگەرگۆشەکان: بوونی ڕێژەیەکی زۆر لە گۆڤاری منداڵان لە ئێستادا تا چەند پێویستە؟
سەرهەنگ: پێویستە بەڵام بەپێی بەسوودی بۆ منداڵ، نەك تەنیا بۆ ماددی و بازرگانی بێت. پێویستیشە چاودێري بکرێن لەلایەن سەنتەری ڕۆشنبیرییەوە.
جگەرگۆشەکان: بە منداڵی چۆن بووی؟
سەرهەنگ: منداڵێکی هێمن و لەسەرخۆ بووم، بەس لەبەر ئەوەی باوکم لەهەمان قوتابخانەدا مامۆستا بوو لە قوتابخانە هاروهاج بووم .
جگەرگۆشەکان: بەمنداڵی بەزۆری کاتەکانت بە چی بەسەر دەبرد؟
سەرهەنگ: تۆپی پێ و خوێندنەوە، گۆڤاری زۆریشم دەخوێندەوە، بەتایبەتی گۆڤاری ( مجلتی و المزمار) کە عەرەبی بوون تا ئێستاش ماون.
جگەرگۆشەکان: هاندەری سەرەکیت کێ بوو؟
سەرهەنگ: باوکم (م.عەبدوڕەحمان) کە هاندەری سەرەکیم بوو. لە قۆناغی سەرەتاییشدا (م. محەممەد کەساس) لە بواری نووسینی منداڵاندا هاندەری سەرەکیم بوو.
جگەرگۆشەکان: هۆی وەستانی گۆڤاری تۆم و جێری چی بوو؟
سەرهەنگ: کەمی باری ماددی و بەداخەوە کەمی هۆشیاری لەلایەن هەندێ لە دایکان و باوکان بۆ کڕینی گۆڤار بۆ منداڵەکانیان.
جگەرگۆشەکان: کاری داهاتووی مامۆستا سەرهەنگ چییە؟
سەرهەنگ: دەرکردنی کۆمەڵێك لە چیرۆکی منداڵانە کە وەرمگێڕاون کە ناویان(شەڕ و بەزالیا ، مایکل فۆرمان).
جگەرگۆشەکان: چیتر؟
سەرهەنگ: دەستخۆشی لە جگەرگۆشەکان دەکەم، هیوادارم بایەخ بە دیزاین بدەن و بابەتی زانستیش زۆر بڵاو بکەنەوە. هیوادارم منداڵانیش گرنگی زۆر بە گۆڤار و کتێب بدەن.

# نیگارەکانتان




منداڵە ئازیزەکان.. دەتوانن لەگەڵ نیگارەکانتاندا وێنەی خۆشتان رەوانە بکەن.....



نیاز حەسەن کەریم
دووەمی بنەڕەتی



دانیە ئەحمەد / دووەمی بنەڕەتی



کاڤار زیاد / هەولێر
یەکەمی بنەڕەتی



ڕووناک عومەر حەمەدەمین

# پێبکەنە

## بەسەرهاتێکی مەلای مەشهور

جارێك مەلای مەشهور کە لە نهۆمی دووەمی خانویەك دەژیا، سواڵکەرێك داوای لێ دەکات دابەزێتە خوارەوە کاری پێیەتی، مەلای مەشهور دادەبەزێت سواڵکەرەکە دەڵێ خێرێکمان پێ بکە، مەلای مەشهوریش دەڵێ: بەدوامدا سەرکەوە، کابرای سواڵکەرییش سەردەکەوێتە نهۆمی دووەم، ئەنجا مەلای مەشهور پێی دەڵێ: نیمە خوا بدات! سواڵکەرەکە دەڵێ ئەی بۆ لە خوارەوە پێت نەگوتم؟ مەلاش دەڵێ لەبەرئەوەی تۆ لەسەرەوە پێمت نەگوت.

## مامۆستای زانست



منداڵێك بە دایکی دەڵێت مامۆستای زانستمان هیچ نازانێ؟

دایکی دەڵێ: چۆن؟

منداڵەکە: هەموو دەم ئەو پرسیارمان لێ دەکات و دەبێ ئێمە وەڵامی بدەینەوە

## شیر بۆ (ئارام) دەکڕێت



کوڕێك دەچێتە دەرمانخانە شیر بکڕێت بۆ براکەی، خاوەن دەرمانخانەکە پێی دەڵێ: ناوی چییە؟ (مەبەست چ جۆرە شیرێك)؟

کوڕەکە دەڵێ: ناوی ئارامە!

# تۆپی باسکە

## فەرهەنگی وەرزش

لەم گۆشەیەدا هەر جارێك باسی جۆرێکی وەرزش دەکەین





بە میللیترین یاری دادەنرێت لەدوای یاری تۆپی پێ لە جیهاندا، ئەم یارییە لەنێوان دوو تیپ لە یاریگایەکی تەخت ئەنجام دەدرێت کە درێژییەکەی 82 مەتر و پانیەکەی 13تاکو 15مەتر دەبێت، بۆ هەر تیپێك 5 یاریزان یاری دەکەن و لەگەڵ 7 یاریزانی یەدەك.

یاری تۆپی باسکە لە 4 گێم پێکدێت و هەر گێمێکیش 10دەقیقە دەخایەنێت، هەر تیپێك زۆرترین خاڵ کۆ بکاتەوە براوە دەبێت، لە کاتی یەکسان بوونی هەردوو تیپەکەش ئەوا کاتەکە 5 خولەك یا زیاتر درێژ دەکرێتەوە، لە یاری تۆپی باسکەدا دوو ناوبژیوان لەناو یاریگادا ئامادە دەبن لەگەڵ 5 چاودێر یا یاریدەدەری ناوبژیوان.

یاریدەدەرەکان ئەرکی تۆمارکردن و چاودێری کردن و گۆرینی یاریزانان لە ئەستۆ دەگرن.

یاری تۆپی باسکە لەلایەن هەردوو رەگەزی نێر و مێ ئەنجام دەدرێت.

| کوردی | عەرەبی | ئینگلیزی |
|---|---|---|
| تۆپی باسکە | كرة السلة | Le bsketbool |

ئا: لەنیا قادر



# گوێدرێژ



گوێدرێژ یان (کەر) لە گیانداره شیردەرەکانە، سەر بە گروپی ئەسپەکانە و بربڕەدارە، بەرزییەکەی دەگاتە نێزیکەی ١٩٠سانتیمەتر و بەشێوەیەکی گشتی ٢٠تا ٣٠سال تەمەن دەکات.

ئەگەرچی (کەر) لە زۆر رووەوە لە ئەسپ و کەرەکێوی دەچێت، بەڵام بەهۆی رەنگی پێست و قاچ و گوێیە درێژەکەیەوە ئاسان جودا دەکرێتەوە.

گوێدرێژ بە گیاندارێکی پشوودرێژ و ئارام دادەنرێت و لە کۆنەوەیش بۆ گواستنەوەی بار بەکارهاتووە، ئەم گیاندارە رووەکخۆرە و بە بەچکەی گوێدرێژ دەگوترێت (جاشکەکەر) و بەدەنگیشی دەگوترێت (زەرە)ی کەر یان سەرەی کەر.

وێرای ئەوە لە بار و گواستنەوەدا بەهێز و خۆراگرە، بەڵام لەکاتی ئەزیەتدان و دابین نەکردنیخواردن و خواردنەوەی پێویست بۆی سەرکێشی دەکات.

گوێدرێژ هەستی بیستنی ئێجگار بەهێزە و زۆر زوو هەست بە بوونی دوژمنەکانی دەکات.





| کوردی | عەرەبی | ئینگلیزی |
| --- | --- | --- |
| کەر | الحمار | Donkey |



# بیر بکەوە

پ 1/



خاوەنی فرۆشگایەك كە جۆرێك لە سەلاجەی هەیە بە 500.000 دینار دەفرۆشێت، لە سەدا بیستی لە فرۆشتنەكە قازانج دەكات، ئەی ئاخۆ ئەگەر بۆ لەمەودوا تەنیا لەسەدا هەشت قازانج بكات دەبێ سەلاجەكە بە چەند بفرۆشێت..؟

پ 2/

گیاندارێكی زەبەلاحە لە هەشت پیت پێك دێت:

پیتی 4+ 7+ 3ناوی گیاندارێكە

پیتی 2+ 5+ 7وەكو یەكن

پیتی 1+ 5+ 3+ 5یەكێكە لە بەرهەمەكانی شیر






لەم چەند
وێنەیەدا تەنیا
یەکێکیان
لەوانی دی
جودایە، دەزانی
کامەیە؟







چەند
جار
سێگۆشەیەکی
زەرد و
چوارگۆشەیەکی
کەسك و
بازنەیەکی
سوور و
سێگۆشەیەکی
شین
لەناو
وێنە
گەورەکەدا
دووبارە
بوونەتەوە؟



## ڕێگە بەم بەرخە پیشان بدە تا بێتە دەرەوە

ئامادەکردنی:
مەریەم عەبدوڵڵا

## هەنگاوەکانی فێربوونی وێنەی بووکەبەفرینە



-١-



-٣-



-٢-



-٤-

# جیاوازی حەوت

حەفت جیاوازی لەنێوان هەردوو وێنەکەدا هەیە لە ماوەیەکی کورتدا بیاندۆزەوە